**هەر کۆچ کۆچت بوو کۆچ نەگەڕیاوە**
**کۆچ بوو بە ئاگر هەر نەکووژیاوە**

# - بارە سێو -
# باری کرد لە شارەکەی هەڵبجە

تۆ گوێ هەڵخە!
رووبارێکم پرسیار و سۆز خستۆتە رێ
به هەوراز و نشێواندا خەریکە دێ

هەست راگرە
پەنجەو قوڕگی پەڕەسێلکەی گەرمیانم
پڕ کردووە لە باس و خواس
قەتارەیان زۆر نزیکە بگاتە جێ

□

هەوالْ دەڵێ

گۆیا باڵت بۆ کۆچێکی بێ وادەی سوور شانە دەکەی

هەوالْ دەڵێ

تۆ خەریکی بە سەر پردی حەزی ـ من ـ دا

کچێنیت رەوانە بکەی

□

نەتدەزانی

پڕ ئامێزی ئەم سووتانە

هیوای دوارۆژم لە بەر پێت دا چاندووە

بۆ نازانی باس و خواسی عەشقێنیتم

بە گوێی هەموو باڵدارێکا چرپاندووە!؟

نەکەی بڕۆی!

بێ پەرژینی گەرمی باسکت

لێمشت و بەستەڵەك ئەم شارە دادەگرێ،

پێم خۆش نییە

تاوانی قڕبوونی شارێك ئەوکت بگرێ.

بەبێ تینی بزە و نیگات
پەڕەسێلکەی گەرمیانیش
دێن و ئاوارە دەمێننەوە،
ئەوسا، لەناو ئەم وەرزی سەرما و سۆڵەدا
رەق دەبنەوە.

نەکەی بڕۆی!
لە رۆژانی مناڵێوە
من لە ئاهی پەڕەسێلکە سام گرتوومی.

خاکەلێوە ١٣٧٢

■ (١)

١

شەوگار
لە کەلەکەی بەستەڵەکەوە لەدایك دەبێ
ئەنگوست لە چاوی هزرم رادەکا،
بەستەڵەك
لە گەرووی برسێتیەوە دادەڕژێ و
پەڕ و باڵی خەیاڵاوی من
دیلی هەوەسی شێتانەی خۆی دەکا.

بۆ کوێم دەبا ئەم گەردەلوولە
من دەمهەوێ لە جەغزی عەشقی تۆ دا
سەمای چریکە فێربم

من دەمهەوێ

لە رۆحی لانەوازی خۆم

پەیکەرێك دابتاشم ـ وەك تۆ ـ

بەشکە دوایین سووتانەکەی

ئەم جارەمی

بۆ بخوێنمەوە.

ئۆقرەم درەنگی بەسەردادێ

دەنگم ناداتەوە و

لە بەژنی خۆی ئالأندووە ئەم گەردەلوولە.

کەدڵدار دەنگی دەدزن

دەبێ باوەش بکا بە گریانا

کەچی گریان

کۆتەڵێکە لە خۆڵەمێش و ...

هیچ.

ئۆقرەم درەنگی بەسەردادێ و

باوەش دەکەم بە پەیکەری خۆماوی تۆدا

کەچی دەبی بە خەونێکی سەربڕاوی
بەردەم ئەم رەشەبایە و
هیچ
هیچ
هیچی تر.

٢

پەنجەم
کوڕە غەریبێکە سەرلیٚ شێواو
بە شوێن پەڕە گریانێکدا دەخولێتەوە
تا چیرۆکی دوایین ئێوارەی بەردەرگاکەتی تێدا
تۆمار بکا

« ئەی ساتە شەکەتەکانی
کڵپە و داڕژان»!
ئێستا لەیلاکەم
ئاخۆ رەزی باڵای
بەسەر دەرانەی کامەماڵەوە
هێشوو هێشوو چاوەڕوانی پۆشیوە؟»

ئەمە پەتای وێنەیەکی خەماویە

خەریکە رۆحم دادەگرێ

کات ئەستەمە

چی بەسەر هات پەنجەکانم؟

برووسکەیە و لەنگەر ناگرێ،

برووسکەیە و گەڕانەوەی بۆنیە ... نی

ئەو پەڕەسێلکەی دەرباز دەبێ لە سەرمەوە

دەگەڵ پرمەی زەردی گریان!

((ئەی ساتە شەکەتەکانی

کڵپە و

داڕژان!))

٣

ئای بەستەزمان

شاعێرە سادەکەی

گڕی باڵای شەمێکت کردە کێلی گۆڕەکەت و

ناویان نای:

وەلی دێوانە

خەریکە لە شوێن
سەمای چریکە و سووتانەکەت
خەڵفە گۆرانییەك باڵا دەکات و
ناوی دەنێن
ئەمن
رووباری گڕ و کینەی دوو هۆز
نێوانی تۆ و دڵدارەکەی تۆ،
شوورەی عاری لەتێ نان و بزە
نێوان من و دڵدارەکەی من

٤
وشە!
ئەی پێغەمبەرە خائینەکەی
سەردەمی هەڵچوون،
دەبێ لە گڕگانی چریکەیەکدا
بتکەم بە خەڵووز
تۆ
هەرگیز بێ زیاد و کەم
نابەیتە وڵاتی شێعر
ئایەتی دەروون!

٥

چ تاسەیەکی عەتراوی
پەنگی خواردووە لە ناخیدا
ـ خاکی قاقڕی تەنیاـ
چ تاسەیەکی بەفراوی...

باران کە ماچی گەردنی دەکات
ئەو چەپك ... چەپك
گوڵی زەرد و سووری دەداتێ.
ـ با ـ
کە ورینگەی تەڕی رووباری بۆ دەهێنێ
ـ ئەو ـ
تۆزە تۆزە جەستەی سووتاوی خۆی
پێ دەبەخشێ

چ بێدەنگ ئەویندار دەچڕێ
خاکی قاقڕی تەنیا،
هاتووم دەگەڵ هاژە و لرفەی
لافاوێکی هاردا رامبژێنی

هاتووم پێم بڵێی

بۆ حاشا دەکەی

لە تاسەی هەڵقرچاوی دەشتی بێنسێ؟

خاڵۆی وڵاتی

بەفراو و هاژە!

٦

ـ ئەی سەرە کاسەکە!

دەتەوێ وێڵی کامە هەندەر بی؟!

ـ (( بەرەوخەویسەررانیئەوژنەغەریبە

[ دەچملەوبنارەدوورە لێیراکشاوە))

ـ ئەی دڵە شێتەکە

خەریکە بەرەو کوێ باڵ دەکەیتەوە؟!

((بەرەوناخیمێژوویەکەمچرپەیڕوڵەگیاندادەکشێمو

[ خۆمیتیادەنێژم))[1]

---

١ـ بەرەوخەوی سەرڕانی ئەوژنە غەریبە دەچم لەو بنارە دوورە لێی راکشاوە

بەرەو ناخی مێژووی یەکەم چرپەی ڕوڵە گیان دادەکشێم و خۆمی تیا دەنێژم

٧

من و ساڵ

دوو دڵداری جوانەمەرگین:

هەردووك دایكمان بەهارێكی كەم تەمەنە

لە ئامێزی باراناوی ئەوەوە باڵ دەگرین و

یەك چركەش

بەر لەوەی پێی بگەینەوە

دەمرین.

٨

دەستی من و

داوێنی تۆ

بۆ كوێم دەبەی، گەردەلوولەكەی

پێت دەڵێن «كۆچی دوایی»!

ئەمن

لە رووباری ئەم خاكە بێمە دەر

دەمرم دەست و بە جێ،

دەبێ من هەینی و هەینی

لێرە
لەم بنارە بێ نیشانەدا
فاتیحایەك بخوێنم
لە سەر ـ گڵکۆ ونـ ـ ە کەی دایکم.

٩

سەرم لە منداڵدانی ئاگری و شاهۆتا گووراوە
دەستەکانم، لە سیروان و زرێباردا
هەنگاوم لە پەنجەی شەماڵی کێلگەیەکی برسێتیدا
دڵیشم
لە سینگی روونی هەرچی کانیاوتدا
من تەمی خەستەی غوروورم
ئالاومەتە بالای کلپەت
کێ ئەتوانێ...
من...
ساتێ...
جیاکاتەوە...
لە تۆ...!
ئای ـ دایەگیان
کێ ئەتوانێ؟

١٠

هەورە سپییەکان
پێغەمبەری تەڕپۆشی زەریان
نامەی وەرزی رابوون
بۆ وڵاتی کانیاو دەهێنن.

١١

لێرە وایە
من دەبێ پێت نەگەم
کیژۆڵە خەمبارەکەی خێڵی تاسە
تۆ
دەتوانی هەنگاو بنێی؟
کەپرێکم بۆ هەڵبەستووی
هەلاشی لە گوڵە مێلاقێ
لە چڵی دەڕێحانێ لە چنووریَ
دیواری لە جریوە جریوی دەبرینان
لە کسپەی هەناسەی غەریبەکەی شارەزووریَ [١]

١- قوربانی تۆزی رێگەتم ئەی بادی خۆش مرور
ئەی پەیکی شارەزا بە هەموو دەشتی شارە زوور

لە سەر دوندی سەفین و هەڵگوردان
کە دەڕوانێتە دەشتی کاکی بە کاکی
دەڕوانێتە جەرگەی کارەساتێ،
تۆ وەرە
با سەخڵەتی ئەو وەرزە شێتەی لە ڕێدایە
بەر لە ماچی تۆ نامانگاتێ. [٢]

١٢

پڕاوپڕی بەرامەی ترسێکی ئاوارە بوون
چاوی خەواڵووی شێعرت
بۆ دەترسی؟!
وڵاتی کوڕە قەرەج،
پەڵە هەورێکی سەرەڕۆی گۆرانی بێژە
تێکەڵ بە خوێنی زوڵاڵی خۆی ناکات
کۆیلەتی خاك

---

٢- لە فولکلۆر وەرگیراوە

بۆ دەترسی؟!
سەما دەگەڵ قەرەجدا هەڵتدەگرێ
لە سەر باڵی رەشەبا
رەشماڵ هەڵدەی
کۆچ دەگەڵ قەرەجدا
فێرت دەکا
باڵی زێوینی بروسك دەستەمۆکەی،

ـ بۆ دەترسی؟!
دەستەکانت بێنە با ...

١٣

پۆلێ خەڵفە کچی باڵدار
به سەر سەرمدا تیژ تێپەڕین،
ڕەوە سێرووبەکی شەکەت
به بەردەم گوندا
کۆچیان کرد

چ بێ وەفان ئەم کۆچەریانە
دەگەڵ بەهار و تەمەن
دڵدارەکانیان بەجێ دێڵن.

١٤

تۆ!

ئەرێ تۆ!

لە نیشتمانی لاساری چۆلەکەدا

بەجریوە بدوێ،

من چووزانم یانی چی

نەهاتنەوە

یە کجاری بوون

کۆچی دوایی

تەنیا بلێسەی چاوەڕوانی یە

لێی تێدەگا گیانم

وەك چۆن دوندی گریداغ

چاوەڕوانە

شەوێ ئاراس بە بەرۆکیدا هەڵگەڕێ

چەپکە ماچێکی لێڵی

بەدیاری بۆ بەرێ

١٥

وشە!
ئەی پێغەمبەرە خائینەکەی
سەردەمی هەڵچوون،
دەبێ لە گڕگانی چریکەیەکدا
بتکەم بە خەڵووز

تۆ
هەرگیز بێ زیاد و کەم
نابەیتە وڵاتی شێعر
ئایەتی دەروون!

■ (٢)

١٦

روانین...

هەنگاو...

پڕیشکە بارانی دەم با- ن

هەر یەکەی لە ڕۆخ شەقامێ

لەبەر دەرکێ

لە سەر شووشە پەنجەرەی

[کڕی خەونێکدا

شەهید دەبن.

١٧

چك

چك

چك هەردەڕوا و دەڕوا و دەڕوا

کات ژمێر

تۆش بە چ وازێکەوە سەیر دەکەی

لەو بەرزی ... بەرزی ... بەرزەوە

١٨

و

ە

ر

ە

خ

و

ا

ر

ێ سەیرکە!

چ بەستەزمانە خیلقەت

لە ڕکەی تەنگی کاتدا لە دایك دەبێ

بێ نیشان

بێ پێناسە،

لە ڕکەی تەنگی کات دا

هەڵدەوەرێ

بێ ئەنوا، بێ بینەر.

١٩

و

ه

ر

ه

خ

و

ا

ر !

من لەم ئاسمانە نەزمەدا ئۆقرە ناگرم

دەمهەوێ سەرێ لە کاکەشانەکان دەم

هەر دەمهەوێ

هەڵبڕێم

لە خولانەوەی ناو ئەم مەداری تەقدیرەم

دڵم

بۆ کەشایەکەی لە دایك نەبوو هەڵپەیەتی:

دەستم

بۆ گوشینی سێوێك

لەو پەڕی پاوانی بوونەوە.

دەستەکانت

بالّداریّکی ئەفسانەیین،

بلّەی نەتوانن

لەم ((**ئەتۆم**))ە تەنگەبەرە رزگارم کەن.

٢٠

گریان ئەلیّی

ها ئەوە ئەگریجەی پەپوولەیی شەو

شەلاّلّی رەهیّلّە بارانی تەزوو،

سووتان ئەلّیّی

ها ئەوە شەپۆلانی جەستەی حەلاج

بەسەر چلّووکی گڕەوە،

کڕنۆش ئەلّیّی

ها ئەوە ...

ئەی چیت دەویّ؟

بۆ پیّم نالّیّی

تا گەیشتن بەو پەڕی تۆ

چەند بالّم ریّگە ماوە؟!

بۆ پیّم نالّیّی

چاوەکانت
لە رەنگی بزۆزی کامە ئەفسانەدا
دێن و دەچن
بۆ پێم ناڵێی؟!!

٢١

چرکەیەك
تەنیا یەك چرکە خەو
مەچەکتم بۆ بکە بەسەرین
با بەسەر پەنجەکانم
کایە بەو ئەستێرە حەپەساوانە بکەم،
با چرۆ بکا لە ناخمدا
خەونی تێکەڵبوون
بە بەهەشتی
گەڕۆکی رۆحی تۆ ...!

٢٢

چم لێ دەکەی؟!

باڵی پێ هەڵگرتووم ئەم تاسەیە

شێتی کردووم

ئەم سنوورە دەسکردەی خۆت

ئەمە گڕ

ئەوە تیغ

ئەوە ئەژدەها

چم لێ دەکەی

ئیتر بێدەنگ نابم

کات بەسەر قامکەکانم ئەنجن، ئەنجن دەکەم

یاخی دەبم لەم گاڵتەیەت

دانامرکێم

تا کو ناخی

پشکۆی ماچی تۆ ...

٢٣

بڵێ دەست ڕاگرن
لێرە نەم کووژن تکایە
خوێنی پیرۆزی من
بەباڵای ئەم خاکە غەریبە نەبڕاوە

٢٤

ئێستا
دەتوانی بڕۆی
لە هەلێکی ترا سەر دەیەوە
ـ ئەی مردن ـ ؟!

ئاخر دەبێ بزانم
بۆ یەك چرکە
ـ تەنیا یەك چرکە ـ
لێك دەپچڕێ یان نا
ئەم جەغزی هات و چۆیە؟

٢٥

وشە!
ئەی پێغەمبەرە خائینەکەی
سەردەمی هەڵچوون،
دەبێ لە گڕگانی چریکەیەکدا
بتکەم بە خەڵووز

تۆ
هەرگیز بێ زیاد و کەم
نابەیتە وڵاتی شێعر
ئایەتی دەروون!

نەغەدە بەهاری ١٣٧٦

## یادداشت (١)

تۆ هەر دەڵێی باست ناکەم
باست ناکەم
کە چی شەوان
تا کوو بەیان
دەست لە بەرۆیێی
خەونەکانم هەڵناگری.

بۆکان ٧٣

## یادداشت (٢)

ئەگەر شەقام
تۆزێ دڵداری زانیبا
ئەگەر شەقام
بیرەوەری دڵدارەکەی شەوانی خۆی
لە بیرمابا،
ئێستا دەبوو
شەقامی هەرچی شارانە
دەگەڵ تۆدا ئاوارەبان.

نەغەدە٧٤

## یادداشت (٣)

باران ساردە و

شەوگار لاسار،

دەوازبێنە!

با سەرخەوێ بشکێنم

لەژێر پێلووتا.

٧٤/٧/١٨ نەغەدە

## یادداشت (٤)

دایکم،

بۆ هەر ئاسمانێکی دیش

کۆچ بکا

دڵی نایە

ژووری سەوزی خەونەکانم

بەجێ بێڵێ.

نەغەدە ٧٤

## یادداشت (٥)

کانیاو ویستی
باڵای بە باڵای تۆ بگرێ
بوو بە رووبار،

وێنەکەتم
لەسەر پێڵووی رووبار نەخشاند
رووبار،
هێند لە خۆبایی بوو
بوو بە زەریا.

٧٤/١١/٦ نەغەدە

## حە یرانی شەقامەکە

بە بەر چاوی شەقامی سام گەستە و
منالآنی بیٚ زماندا هیٚنایانن
بالٚ بەستراو
چاو لە تویٚی دەسمالٚیٚکدا گریٚدراو

هیٚنایانن
نەیانزانی ئەگەر شەقام
شویٚن هەنگاوەکانیان ئەداتە دەس با و باران
منالەکان ویٚنەیان دەگرن
«ویٚنە» لەبیری منالٚدا چرۆ دەکا
«ویٚنە» لەبیری منالٚدا دەبیٚ بە حەیران.
لە دوا ڕۆژ دا دەیلٚیٚنەوە
بۆ دار بە دار و
کۆلاٚن بە کۆلاٚن.

## کۆترەکانی وڵاتی من

کۆترەکانی وڵاتی من
را نەهاتوون
لە پەلکی گوڵە سیمانییەکان دا
ئاو بخۆنەوە

ئەو کتێبە ببەستن
باسی سەوزەڵانی و
کانی و
بەرامەی لە خۆی تەراندووە!!

کۆترەکانی وڵاتی من
هەر هیچ نەبێ
دەنووك لە زامی یەکترا تەڕ دەکەن.

نەغەدە ٧٥/١٢/٢٤

# w i
# _ l _ a _ t

«من نامهەوێ غەریبانە بژیم»

لە سەمای گەڵایەکی وەریودا دەدۆزمەوە

نیشتمانێك بۆ ـ ژیان!

«من نامهەوێ نا... بێ وڵات بمرم»

لە پێکەنینێکی مناڵانەتدا دەدۆزمەوە

نیشتمانێك بۆ ـ مردن!

٧٦/١٠/٢٤

((غە ریب وە کوو خاک

وێران[٧] وە کوو خۆم))

**ئێستا ـ م**

**میوەیەکی تفت و تاڵە**

**لە زارمدا**

**هەنگاوەکانم**

**راکێش ... راکێش**

**لە جانتای رێگایەکی نابەدڵا دزران**

**پەنجەکانم**

**لەوێ**

**لە گرێوگەوی گوڵی مافوورەیەکی وێرانا جێمان**

«من... چیم بەسەرهات؟
تۆ... چ زوو تۆرای
منالّی! ئەی خوشکە کالّەکەم؟!»

خاك و خۆلّ
ئامێزێکی دایکانەیە
لە بیرمدا شەپۆل دەدا
غوروورى کالّی چرۆ
لە حەوشەی مانگەشەوەوە بانگم دەکا

«غەریبی تەمەن... خەریکە دەمکا
بە خەلّووز.»

بمگەڕێنەوە
لە ناو گەڕەلاوژەی قاقاو
تۆپەلّە بەفردا بمچێنە!

**بمگەڕێنەوە**

**لە بێ سنووری مانای سفرە و کۆترەباریکەدا**

**بمنێژە**

**((خوشکە کاڵەکەم!**

**گەورەیی ئازاری ئەم دوورییەت**

**پیر پیری کردووم.))**

**٧٦/٣/١٥ نەغەدە**

## یادداشت(٦)

کلوو
کلوو
دادەبارێ
بەفر
تاڵ
تاڵ
دادەوەرێ
مووی سەرم
تۆ بیر لە دزێوی شەوێ دەکەیتەوە
ژوورە خەیاڵییەکەت جێ ناهێڵێ
من بیر لە پیرۆزی گوڵدانێ دەکەمەوە
یەکەم ماچی ئێمەی
تیا دەگوورێ

## یادداشت(٧)

لاسەشۆڕی باڵەکی
چەپکێ گوڵی شۆڕان و
وڵاتێکی خەزاڵین.
چۆلەکەش
دارستانێك پڕ جریوە و
هێلانەیەکی قشتیلانە
لە سەر چڵووکێ.

ئەی (من) چیت بۆ بهێنم؟!
ئاوارەکەی ناو چرپەزاری بێ پەڕو پۆم،
چیت بۆ بهێنم:

لە سەرشانی خەیاڵێکی وێران
[هێلانەیەك و
لە دەستە بچکۆلەکانی تۆشدا
تەنیا
نامەیەك
شك دەبەم

٧٦/٤/١٥ نەغەدە

## کاروانێك سوور لە سەر رێ

بەدەم یاوی ئەم رێگە لێڵەوە
وەرز وەختە سپی سپی بکات
سەر و پرچی
درەنگە!
میراتگری رێگەی هەتاو و رووبارە ـ کاروان ـ
تێ ناگات لەزمانی پسکی هەنگاوی من و تۆ
درەنگە!
خەو ـ میوانی ناوەختی بێ مەنزڵە
ـ ئێمەش ـ سیاسەتمداری حیزبی عەشقێکی سەرەڕۆ
خەو ـ کۆت و بەندی مانەوەیەکی بۆگەنە ـ بیخە پشت
[گوێ!
ئێمەش ...

بۆ چی دەگری؟!

بۆ کوێ ئاوڕ دەدەیتەوە؟!

رابردوو نەهەڵمان دەگرێ بمانبا

نە شوێن هەنگاوی ئێمە دەدۆزێتەوە

بێ بە دووماندا

رابردوو ـ لەدێراوی دوێنێ و پێرێدا نەبێ ناژی

من و تۆ

لە وڵاتی سبەینێدا نەبێ ناڕوێین.

مەترسە!

کەدەرباز بین لە چل پلەی عومام

ئەو بەر چرپەگای پەریانی

رووت و قووتی ناو ئەفسانەکانە،

ئەوبەر هەوارگەی خێڵی بەیان و تریقەیە.

کوڕانی وێ

بە سۆزی شێعر و سازی هەرەس بلووغ دەبن،

**کچانی وێ**

**بەدەم گارەگاری شەماڵ و**

**بلوێری چەکەوە دادە نێن بناخەی مەمك.**

**شەپۆل دەدا شەپۆل**

**بێدەنگ ... بێدەنگ دەئاژوێ،**

**میراتگری تاقانەی زەمانە و**

**دانە ... دانە**

**دادەڕژی بە دویدا ڕۆژانی تەمەن.**

**دەئاژوێ دەئاژوێ**

**کاروانێك لەهەزاران (من) و**

**هەزاران و یەك (ئەتۆ)**

**(( کاروانێك سوور لەسەر ڕێ ))**

بەهاری ٧٦

6349(٥شەممە کاتژمێر ٥/١٠)

.6

.3

.4

.9

**ـ ئەلۆ!**

**ـ ئەلۆ فەرموو!**

**ـ سڵاو ئەی یار**

**ـ سڵاو هاوڕێ چۆنی؟**

**ـ چۆنم؟!**

**لێڵی لێڵم**

**بە ڕەنگی نیشتمانی وێڵی پەپوولە پاییزە**

روونی روونم
لە چەشنی رۆحی دیلی دەست كێڵگەی ـ باران.
راچەنیوم لە فڕكەی باڵی باڵدارێك

ـ چ باڵدارێكە هاوڕێ
وا هەواڵی ترسی پڕژاندووە لە دەنگت؟!
ـ نازانم،
هەر ئەوەندە
خەونی وەرزی لێك دابڕانم ئەبینی
لە دوادوای قەتارەیەكی سپیدا
جەستەی بە دەم باڵەكانییەوە ئەكشا
ـ باڵدارێك لە رەنگی نیشتمانی مەـ
رۆحیشی لە ئاوڕدانەوەی سات بە ساتی
ئەم درەنگە پاییزەدا، هەنیسكی ئەدا.

□ ٢
ـ ئەلۆ!
ـ بەڵێ شیرین،
ـ لە كوێوە دەدوێی

دەنگت ... کاڵی ... کاڵە؟

ـ لێرەم سێوێ

لە نێوان حەزی مانەوە و

راکێش راکێشی فڕینێکی کۆچاویدا،

لێرەم

لە سەر رێژگەی

ماڵاواییە کوتوپڕەکانی کارەساتدا

باڵ بە باڵی خورپەیەکی بێ وڵات

هەر دەکشێم و

هەنیسك ئەدەم

هەنیسك ئەدەم.

بیرەوەری: شەوەزەنگ

ئێستا: ژووری باڕووت و دووپشك،

سبەینێ: کۆڵانێکی تەنگەبەرە

شانەکانمی پیا ناچێ،

مانگ: ماچێکی تاڵی خوێناوییە

بە سەر رومەتی ساردی پەنجەرەوە

○○○

دادەنیشم لە رۆخ ئەم هەناسە هەتیوەمدا
با ـ لك و پۆپم دەلاژێنێ
شەپۆل ـ خاك و خوێنی جەستەم دەشواتەوە و
لیڵ تر دەبێ
تۆ بیر لە من دەکەیتەوە
کە خەریکم حکوومەت دەکەم
بە سەر سێبەری خۆمدا!
با بیر لە زناریك دەکاتەوە
رایبرژێنێ
چۆم
بیر لە ترۆپکێك،
رایبمووسێ.

لە نێوان سێبەری خۆم و خۆتدا
نارنجۆکێك چاوی کینەی چرە،
لەنێوان دڵ ـ ی من و پەنجە ـ ی تۆدا
شمشێرێك راکشاوە.
لێرە دڵم ناکرێتەوە
هەنگاو ... هەنگاو ...رێگە دەمبرێ

کچێکی سیمانی چاو حیزە ـ شەقام،
سەر دەردێنی
لە بووتیکی کرێوە و دووکەڵەوە
دەست لەگەردنم دەکا
رێکم دەگوشیٚ توند توند،
من ـ تەنیا باسی دڵشکاوی خۆمی بۆ دەگێڕمەوە
ئەو ـ پێدەکەنیٚ قا قا قا قا.
هەناسەی
هەنگوینی ترین ژەهری ئەم غەریبیە
ددانەکانی
دلۆڤان ترین چەقۆ.

دێم پەژارەم هەڵدەکەنم
لەسەر بەردێك
باران دەیشواتەوە و
ناوی دەنیٚ «گۆڕستانی جندۆکە»
سەرم دەنێمە سەر سینگی بنارێك
گویٚ لەترپەی دڵی شەهید بگرم

برووسك سەمای تیا دەکاو
دەیکا بەخە ڵووز

جارێك
تەنیا جارێك
دایکم ماچ کرد
شەقام بوو بە گورگ
بوو بە گڵکۆی ماچی من و
دەستە سپێکانی ئەو.

رەنگە ئەگەر بشڵێم «خۆشم دەوێی»
بێن بە گوێما بچرپێنن:
«دەزگیرانە چاو رەشەکەت
باڵای بەرزە ... بەرز بەرز
بەقەت دارە مەیتەکەی
سبەینێ بەیانی زووی تۆ ...»

پەردەی ئەم ژوورە گریاوەم لامەدە!
لەوە تاریکترم

پێکەنینت دامبگیرسێنێ.
لێ گەڕێ!
با نەژاکێ ناهومێدیم
تەنیا بۆ یەك ((سلاو)).
بۆ یەك ((چۆنی)).

من بیر لە داڕمانی ئەندێشە
بیر لە داڕزانی ئەستوونی جەستەم
دەکەمەوە
تۆ
لەمنێکی سەوزی سەوز
لە بزەیەکی مێلاقەیی
لە وشەیەکی
ئازادی
بەرپەنجەرە دەڕوانی.

(بێدەنگی)

**ـ بۆ بێدەنگ بووی!؟**

+...

**ـ بۆ بێدەنگ بووی!!!؟**

**+ ه ... خخخخخەریك بووم**

**ئاوارەیی گەڵایەکم دەخوێندەوە**

**لە مەندی چاوەکانی**

**تۆدا**

**کە**

**با ـ**

**ئەیبرد**

**تۆ بۆ ناسرەوی؟!**

**دەفتەری یادداشتەکەم بۆ وا دەپشکنی**

**ئەوەتا**

**لە بیلبیلەی چاوی منا غەم دایگرتووە**

**ئەو پەریەی خۆشترم دەوێ لە تۆ**

**تەم دایگرتووە**

**ئەو وڵاتە چاوڕەشەی**

**دەمهە وێ بچم**

**خۆمی تیا وێران بکەم**

## لێرە دڵم ناکرێتەوە

سەرم تەراویساڵی
«چۆلەکە کوژرانەکەیە»
یاغی ترە
لە دان
لە ئاو
لە حەسانەوەی سەر هەوری شانی تۆ

**لێرە دڵم ناکرێتەوە**
پێنووسێك و
هەگبەیەك شێعری شێرکۆ بێکەس و
لەچکەیەکت
بۆ نامە قاچاغەکانم
کات: درەنگە
ڕێگە: دوورە
بێ تێشوو ناژی ڕێبوار

سەرماوەزی ٧٦

## یادداشت(٨)

چاوم پێت دەکەوێ

لە گاراجێکی گەورەی ئەم غوربەتیەدا،

ئەمجارەیان

تۆی و

تاراکەت و کوڵی شێعر و ـــــ ئەمن

ئەمجارەیان

منم و

زامەکانم و ئوتوبووس و ـــــ بوومە لێل

دەستت دەگرم

و

ڕێ دەکەوین

وڕێگە دەبڕین

وڕێگە دەبڕین

وڕێگە دەبڕین

# یادداشت(٩)

تۆ منت خۆش ئەویٚ و

من ...

هەڵۆش چیای خۆش ئەویٚ و

چیا ...

شەهیدیش خاکی خۆش ئەویٚ و

خاك ...

بارانیش تۆی خۆش ئەویٚ و

تۆش

ئەمن

ئەمەیە رازی نەبڕانەوەی مەنزوومەی عەشقیٚنیمان.

شنۆ ٧٧/١/٢٢

## یادداشت(١٠)

بزەی لەبیر دەچێتەوە

ــ چرۆ

پەڕووپۆی هەڵدەوەرێ

ــ زەمان

نوقم دەبێ لە تراویلکەی وشەدا

ــ ئەمن

باسم بۆ بکە!

چیە رازی حکومەتی

ــ نیگات

بۆکان٧٧

بۆهاوڕێم محەمەد ئەحمەدی و خەونەکانی

# چەمەڕای هەڵچوونێکە
# خاک

لە بزەتدا لەنجە دەنوێنی گوڵی گەنم

نەرەوتی ملۆدی با دەزانی و

نەگارەگاری وەرزی بەسەرچوون دەناسی

نازانم چۆنت بدوێنم

لەخەوی کرێشەیی کراسەکەتدا

خاك

چەمەڕای هەڵچوونێکە ـ وەك پتی خوێن

نە زمانی برسێتی ئەزانی و

نە رێنووسی شەتاو

نازانم چۆنت راژێنم

نازانم نا!

... ئاسمانی چی؟!

تۆ ڕێکەوت هەڵیگرتووی

تا لەڕکەی چاوەڕەشەکانی خۆتا

هەر هەڵفڕین و کچێنی خۆت لە تەنیاییت بهاڵێنی

یەقینی چی؟!

گومان کۆماری دیکتاتۆری لەدایك بوونی تۆیە

هیچ ...

هیچ کڵاو کووڕەیەك

لە جوغرافیای شێت و شووری قژتدا

هێلانەیەك شك نابا
هەرگیزا و هەرگیز.

ئاااای

ئەمە سەرەتایە یان کۆتایی

ئەوە ئاوزینگدانی ساڵی گەنمە یان

عەشقێنی دووکەڵی سەردەم

**تۆ**

چەندە

شێوەی نهێنی ئەدەی!!

٧٧/٥/٣ بۆکان

# *close up*

□

ـ بە روخسەت!

ـ بۆ کوێ ئەچی؟ تازە خەریکە تینوێتیم پێبگا

ـ ئاخر لە چاوەڕوانی منا ئێواران

ڕێگاکان ئەبن بە گورگ

ـ مەترسە

گورگەکان زوو پیر دەبن!

« بی قە راریٚ لە نجە ئە کا نە رم نە رم

٧

تو لە چکە کە ت دە کە یە وە

٧ ٧

رە شە بایە ک هە ڵدە کاتی،

نوقمی کە زو دە بین و نوقمی زە نا زە نای ترس

٧

تو له چكه كه ت با ئه يبا و ...

من په نجه كانم.

٧

هه لده وه رن كلوو ... كلوو ...

وه ك خورپه يه كى په يتووكه»

■

# [ close up ]

ـ روخسەت

ـ مەرۆ ... ئەترسم لەم چاوەڕوانییە درێژەدا ... [ شەو ئەبارێ بە رەهێڵە ] ڕێگاکان بێن بەگورگ

[ شەو ئەبارێ رۆندك

رۆندك]

ـ کات درەنگە ئەبێ بڕۆم

[ دەگەڵ هەنیسك بە هەنیسكی

هەنگاوەكانی تۆدا

دا ئەبارێ شەوەزەنگ]

ـ ماڵئاوا!

[ تەنیاییم شەلاڵی لوورەی

ڕێژنەیەكی سوور ئەبێ]

ـ ماڵئاوا

ـ ماڵئاوا ... ڕووناکی دیدەم

ماڵئاوا

هاوینی ٧٧

## نامەکانم بدەن بە ئاگر بۆم دێنیَ

لەیلاگیان!
چەند رۆژێکە ئاژاوەیەك هەڵیگرتووم
برووسکیَ حیلە و کۆرژنێتی لە سەرمدا
خۆ نە ناوی خۆییم پیَدەڵیَ
نە نیشانەیەکی دەزانم بۆتانی بنووسم
ئیتر ئەوناما نەی بۆم دەنووسن
ئادرێسیان ناویَ
بیدەن بە گڕ بۆم دەهێنیَ

لەیلا!
پەنجەرە!

فەوزیە!

رامان!

گوێتان لێمە؟

ئادرێسیان ناوێ نا ...

ئاژاوەیەك هەڵگیرتووم

بە گرفەگرف

بەرەو ژوورێکی بێڕەنگی رەنگ

نە دەرگاکەی ژمارەی لە سەرە

نەکۆڵانەکەی ناسناو و

نەشارەکەی سەر و شوێنێکی هەیە.

بیدەن بە ـ گڕ

بیدەن بە ـ تیاچوون

بۆم دەهێنێ.

١/٧/٧٧ ـ بۆکان

# هەموو شتێك ... هیچ

شارێك دەنووسمەوە
خانوو بە خانوو
سڵاو بە سڵاو
ئەیسووتێنم
باخێك دەكێشمەوە
دار بە دار و
جریوە بە جریوە
ئەیدڕێنم
« شێعرێك» دەهۆنمەوە
پیت بە پیت و
«خۆم بە خۆم»
ئەیمرێنم

٧٩/٢/٢٠

## یادداشت(١١)

ڕەوتی تۆ لە درێژترین نامۆیی دا و
پڕژانی من لە نووتەك ترین ئاوڕدانەوەدا
ـ لە بیرتە چ شەوێك بوو کڵاو کووڕەیەکی
[ماندوو
بە ڕەوتی ئەم هەمووە پێکەنینەتدا
[ڕابوارد
ـ نا ... ڕەنگە ئەو شەوە ئیدی لە شەوژمێری
هیچ ساڵێکدا نەمابێ ...

میوانی گوڵە سیمانیەکانم
دەنووك تەڕ دەکەم لە پەلکیان دا

(تۆ! چ سووری سوور ...)

لەنجەت هەڵ دەپروێ لە گژەبای ئەم شەقامەدا

(چ نووتەك ئەم شەقامە چ نووتەك)

ـ لەبیرتە چ شەوێك بوو ...!

ـ پێم گوتی! رەنگە ئەو شەوە

لە شەو ژمێری ...!

ئاخ نە كڵاو كوورەیەك رادەبووری تازە

نە پێكەنینێك دەرسكێتەوە بۆ هەڵوەرین

جارێكی تر.

٧٩/١٢/١٧ نەغەدە

## یادداشت(١٢)

**ئەی بەیدەسترین رەنگی گوڵاڵەی** ...

**نا نا** [ ببوورن ...

**ئەی وریشەی پەیتووکەترین پێکەنیــ** ...

**نا نا نا** (ئەمجارەش...

**ئەی مزرترین و بلوورین یەزدانی ژوور** ....

**ئەهەه ه**

**ئەی تۆ!**

تۆ ئەڵێم تۆ!!

چەتری سپی، سەعاتی سیتی زێن

کیفی شان و قژ و کەوشی تۆزاوی خۆت!

«زۆر ئەترسم ئێوارەیەك

لەشەقامێکی پڕلە هاتو چۆدا ونت بکەم»

٨٠/٣/٥ـ بۆکان

## - سەردان _

زەنا زەنای چ ترسێکی ئاڵۆز
له غەریبیت دا
مەرگێکی چەند سادە ـ چەند سادە
له کۆچا و کۆچتدا
(چەند سادە ــ چەند سادە
ئەمهەویست بە سەر داڕوخانت دا ببارم)
بەڵام!
کە سەرما دێ و
سەر بە ماڵە و ماڵی رۆژەکانت دا دەکا
نەدار وەرزێك دێتە دواوە و
نە تۆش سەوز دەبیەوە تازە.

*ـ بە کوڵ دەگریم و هیچی تر ...ـ*

چ لە پڕ رووی دا
گووران و باڵیان گرت و جێیان هێشتی
ساڵەکانت

چ لە پڕ رووی دا

بەر لەوەی گەڵایەك چرتە بکا

ئاوا منالانە پیر هەڵگەڕای.

□

ئاااخ

کە سەرما دێ

سەر بە ماڵە وماڵی رۆژەکانت دا دەکا

ئیتر نە دار وەرزێك دێتە دواوە و

نە تۆش سەوز دەبیەوە ...

٧٩/٨/٧ ـ بۆکان

# تا هەڵچوونی زام ... تا مانگەشەو

ئەی هەتوانی نیانی زێوین

ڕێگە دەرناکەی نا

کەمێ خوارتر

گەماری چڕی سەردەم و

بادەوەی دووکەڵە



٧٩/٥/٢٠ ـ بۆکان

# سەفەر

تۆ رۆیشتی

منی هەموو ئێواران سڵاو

رووت رووت رووتی کردمەوە

تەنیایی

بارانێك شووردیەوە

دوور

بایەك شەمزاندتی

غەریب

تولەرێیەك تێت ئاڵا

(نازانم چۆن ......

گەڕایەوە

پڕ مەراقی هەموو شتێك لە نوێوە

گوتمان:

دەفتەری یادداشتی رۆژانەی تۆ

پڕپڕ لە من

دوور   غەریب   نازانم چۆن،

بەجێما تۆیەك لە من

منی تەنیاتر

تەنیاترین

٨٠/١/٢ ـ بۆکان

پێرست:

فرمێسکە شەهیدەکان
گۆرانیە غەریبەکانی دایکم
چاوە رەشەکانی فەوزیەی دڵدارم
ئەم هەناسانەیان
پێشکەشی
من
کرد